# وتەکانی پاولۆ کۆیلیۆ

# حەکیمانە

وەرگێڕانی

یوسف محەممەد و کارا فاتیح

کوردستان — هەولێر
٢٠٠٦



**ناوی کتێب: حەکیمانە**

– وتەکانی پاولۆ کۆیلیۆ
– وەرگێڕی فارسی: ئارشی حیجازی
– وەرگێڕانی بۆ کوردی: یوسف محەممەد و کارا فاتیح
– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
– بەرگ: سەیوان سەعیدیان
– پیتچنین: کارا فاتیح
– هەڵەچن: کارا فاتیح
– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
– تیراژ: ٧٥٠ دانە
– ژمارەی سپاردن: ٤٩
– چاپی یەکەم ٢٠٠٦
– نرخ: ١٥٠٠ دینار

زنجیرەی کتێب – ٤٨– (١٥١)

ناونیشان
دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن : 2260311
www.mukiryani.com





شتی حەتمی هەمیشە روودەدات، بۆ سەرکەوتن بە سەریدا ئارامگری و رێکوپێکی پێویست

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

کاتێك بەخت یاوەرمانە پێویست دەکات سوودی لێوەربگرین و بۆ هاوکاریکردنی هەموو کارێك بکەین، هەروەك چۆن کە ئەو یارمەتیمان دەدات.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

هیچ کەسێك ناتوانێت وەختێ راست لە چاوانمان دەڕوانێت، شتێك پەنهان بکات.



لە ژیاندا عـەشـق دەبێت موومکین بێت، تەنانەت ئەگەر کاردانەوە و وەڵامی هەنووکەییشی نەبێت، عـەشـق تەنها لە کاتێکدا بە زیندوویی دەمێنێتەوە کە ئومێدێك بۆ فەتـحکردنی مەعشووق هـەبێت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

تەنهایی دەتوانێت ببێتە هۆی دروستکردنی پەیوەندیی مرۆڤ بە جیهانی نەبینراوەوە، وەلێ دەشبێتە هۆی فەوتانی پەیوەندییەکانی لەگەڵ مرۆڤانی تردا.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

پێویست نییە بزانین چۆن، پێویست نییە بزانین لە کوێ، بەڵام لە سەرەتای هەر کارێکدا دەبێت لە خۆمان بپرسین: ﴿ بۆچی دەبێت ئەم کارە بکەم؟ ﴾





رووی فریشتەکەت ئەو شوێنەیە کە خۆتی تێدا دەدۆزیتەوە. چارشێوەکەی بە پرشنگی خۆر لە رۆژدا دادەپۆشێ و شەویش بە درەوشانەوەی ئەستێران.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

جەنگاوەری نوور تەنهایی بەکاردەهێنێت، بەڵام ناهێڵێت تەنهایی ئەو بەکاربهێنێت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

چ شتێك لە خۆتت بێزاردەکات: لەوانەیە هەمیشە لە هەڵەترسان بێت.



هەموو کەسێك وەها بیردەکاتەوە کە بە درووستی دەزانێت ئێمە دەبێت چۆن بژین، بەڵام هەرگیز نازانێت چۆن ژیانی خۆی تێپەڕێنێت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

مەسەلە سادەکان ناسرووشتیترین مەسەلەکانن و تەنها دانایان دەتوانن بیانبینن.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

هەموو کەسێك شمشێرێکی هەیە، دەبێت بەردەوام تاقیبکاتەوە، نەبا لە کێلانەکەیدا ژەنگ لێی بدات.

عەشقی ڕاستەقینە هانمان دەدات تا هەر کەسێك
وەدووی ڕێگەی خۆی بکەوێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

مرۆڤ دەبێت چارەنووسی خۆی هەڵبژێرێت نەوەك
قەبووڵی بکات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بە تێپەڕبوونی کات هێزێکی هێمادار هەوڵی خۆی
دەستپێدەکاتەوە، بۆ سەلماندنی ئەوەی کە
بەئەنجامگەیاندنی ئەفسانەی کەسی مەحاڵە.



کاتێك بەرەو ئامانجێك دەکەویتەڕێ سەرنجدانی جادە
زۆر گرنگە. جادە باشترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە
ئامانجمان فێردەکات و، لە کاتی گووزەرکردن پیایدا
سەرڕێژمان دەکات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەمیشە پێویستە مرۆڤ بزانێت کەی قۆناغێك لە
ژیانی تەواو بوە، ئەگەر دوای ئەوە بە سەرسەختییەوە
چنگی بداتێ، چێژ و مانای قۆناغەکانی دیکەی ژیانی
لەدەستدەدات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

تەواوی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەویدا لە گەڕان بەدوای
عەشقدا کورتدەبێتەوە، تەنانەت ئەگەر لە پشتی
پەردەوە عەشق بۆ حیکمەت، پارە و دەسەڵات
کورتبێتەوە.

ڕۆحی جیهان لە خۆشبەختیی مرۆڤەکانەوە خۆراك وەردەگرێت، یان لە بەدبەختی و ناکامی و حەسادەتی ئەوانەوە.

کاتێك هەموو ڕۆژەکان یەکسان بن، مانای وایە ئیدی مرۆڤ ناتوانێت ئەو ڕووداوە خۆشانە دركپێبكات، کە بە هەر جارێك سووڕانەوەی خۆر بە ئاسماندا لە ژیانیدا ڕوودەدەن.

تاریکترین سات بەر لە هەڵهاتنی خۆرە.



لەگەڵ خەونەکانتدا مەجەنگە، لە تۆ زۆر بەهێزترن. ئەگەر دەتەوێت لەدەستیان ڕزگارت بێت، دەبێت قبووڵیان بکەیت. دەربارەی ئەوەی دەیانەوێت بیربکەرەوە، تا ئەو کاتەی ماندوو دەبن.

مرۆڤ پێش دەستەبەربوونی چارەنووسی، دەبێت قۆناغگەلێکی زۆر تێپەڕێنێت.

مرۆڤەکان زۆر زوو مەبەستی ژیانی خۆیان فێردەبن، ڕەنگە هەر لەبەرئەمەش بێت کە زۆر زوو وازی لێ بهێنن.

هەرچی زیاتر دەربارەی خۆت بزانیت، باشتر لەم جیهانە تێدەگەیت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەمیشە دەتوانین بڵێین ئەو بەردەی ئەوانی تر بۆیان هەڵداوین بەرمان نەکەوتوە، تەنها لە کاتی شەودا دەتوانین لە بێدەنگیدا بۆ ترسنۆکیمان بگرین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

پێویست نییە مرۆڤ سەرکەوێتە سەر کێوێك بۆ ئەوەی تێبگات کە بڵندە.



کەشتی لە کەناردا زۆر سەلامەتترە، بەڵام لەبەرئەمە دروستنەکراوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەو کاتەی بە رێگایەکدا دەڕۆین کە هەمیشە ویستوومانە بڕۆین، خەم تا ئەبەد بەردەوام نابێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

گوێ بۆ هاواری دڵت بگرە، دڵت هەموو شتێك دەزانێت، چونکە دڵی تۆ هەمان ئەو شوێنەیە کە گەنجینەکەتی لێ شاردراوەتەوە.

هەوڵدان سەلامەتبەخش و پێویستە، بەڵام هەوڵدانی بێدەرەنجام هیچ بەهایەکی نییە.

تەنانەت خوداش دۆزەخێکی هەیە: عەشقی بۆ جۆری مرۆڤە، هەر مرۆڤێکیش دۆزەخێك لە تەنیشتییەوەیەتی کە عەشقیەتی بۆ خێزانەکەی.

زمانێك بوونی هەیە کە لە وشەکان فراوانترە، ئەگەر کەشفکردنی هێماکانی ئەم زمانە بێقسەیە فێرببیت دەتوانیت جیهان بە رەمز کەشفبکەیت.



دەبێ گوێ بە هاواری ئەو منداڵییە بدەین کە ڕۆژگارێك وابووین، منداڵێك کە هێشتا لە دەروونماندایە .

شەقامی تۆ تەنها یەکێکە لەو شەقامانەی کە دەگاتە لای خودا.

هەر کەسێك بیت، هەر کارێك بکەیت، کاتێك شتێك لە ناخی دڵتەوە دەخوازیت لەو ڕووەوەیە کە ئەم خواستە لە ڕۆحی جیهاندا لەدایکبوە.

گۆڕینی شێوەی ئەنجامدانی کارە ڕۆژانەییەکان ڕێگەت دەدات تا مرۆڤێکی نوێ لە دەروونتدا گەشەپێبدەیت. لە ڕاستیدا بڕیار لەلایەن خۆتەوەیە.

هەر وەك چۆن ڕووبارەکان ڕێڕەوی خۆیان دەگۆڕن، ئامانجەکانی ئینسانیش گۆڕانکارییان بەسەردا دێت.

عەشق تەنها ئەو کاتە دەمرێت کە دەگاتە ئارامی، عەشقی زیندوو هەمیشە لە ململانێدایە



پردێك بەرەو ڕووی جیهانی نەبینراو لەبەر دەستی تۆدایە، دەتوانیت بێترس لێوەی تێپەڕیت، هێندە بەسە کە ئیمانت هەبێت.

لەوانەیە خوداوەند بیابانی دروستکردبێت بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بە بینینی دارخورمایەك بزەبکات.

کاتێك ناتوانین بگەڕێینەوە، تەنها دەبێت لە بیری باشترین شێوازدا بین بۆ ڕۆیشتنەپێش.





له هه‌موو چرکه‌ساتێك سوودوه‌ربگره، تا له دواییدا په‌شیماننه‌بیته‌وه، بۆ لاوێتیی له‌ده‌ستچووت مه‌گری. خواوه‌ند بۆ هه‌موو ته‌مه‌نێك شتێکی به ئه‌مانه‌ت داناوه.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ته‌نهاڕێی دۆزینه‌وه‌ی ڕێگه‌چاره‌ی ڕاست، ناسینی ڕێگه‌چاره هه‌ڵه‌کانه.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بونیاتنانه‌وه‌ی ژیانێك دژوار نییه، هێنده به‌سه مرۆڤ به شێوازێکی ئاگایانه به هه‌مان ئه‌و هێزه‌ی که پێشتر هه‌یبوه درێژه‌ی پێبدات و سوود له‌م هێزه بۆ به‌رژه‌وه‌ندیی خۆی وه‌ربگرێت.



هێنانه‌بوونی ئه‌فسانه‌ی که‌سیی تاکه ئه‌رکی مرۆڤه‌کانه، هه‌موو شتێك ته‌نها یه‌ك شته.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

له عه‌شقدا هیچ مه‌ترسییه‌ك نییه، هه‌زاران ساڵه مرۆڤه‌کان به شوێن یه‌کدیدا گه‌ڕاون و یه‌کتریان دۆزیوه‌ته‌وه.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

خوداوه‌ند نزای ئه‌وانه ده‌بیستێت که ده‌یانه‌وێت ڕقوکینه‌یان لێ وه‌ربگیردرێته‌وه، بۆ نزای ئه‌وانه‌ش که ده‌یانه‌وێت له عه‌شق رابکه‌ن گوێی گرانه.





نابێت ئارەزووی گەڕان بە دوای کێوە بڵند و بڵندترەکاندا بفەوتێت، وەلێ دەبێت خۆمان لەو بیرە رزگاربکەین کە کێوە فەتحبوەکان زۆر بچووکن.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

تەنها رێگای بڕیاردانی درووست ناسینی بڕیاری نادرووستە. دەبێت بێترس و ناخۆشی رێگاکەی تر بپشکنی و ئەوجا بڕیاربدەیت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

پەیمانبەستنەکان هەرگیز رێگر نابن لە رۆیشتنی ئینسان بە دوای خەونەکانی خۆیدا.



لەو شوێنەی پێویست دەکات عاقڵ بیت، پێویست ناکات ئازا بیت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

بێدەنگی هەمیشە مانای رەزامەندی نییە، عادەتەن تەنها بێتوانایی کاردانەوەی خەڵکی نیشاندەدات لە کاتی خۆیدا.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

عەشق هێزی ئەنجامدانی مەحاڵ بە ئینسان دەبەخشێت.

هەموومان هەموو رۆژێك سەرووكارمان لەگەڵ شتە
نائاساییەکاندایە، ژیری لە ناسینی شتە نائاساییەکاندایە
لەودیو پەردەی ژیانی رۆژانەوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بۆ فێربوون تەنها یەك شێواز بوونی هەیە: بەکردەوەکردن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەگەر بهێڵیت گۆڕانکاریی رووبدات خۆت دەگۆڕێت بۆ
کێڵگەیەکی بەپیت و، دەهێڵێت بیرکردنەوەیەکی داهێنەرانە
شەتڵەکانی خۆی لە تۆدا بنێژێت.



فێرکردن نیشاندانی ئەوەی کە بوە و دەبێت، فێربوون
دروستکردنی دەبێتە بۆ خۆت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

کار تەنها کاتێك تەواوە کە گەیشتبێتە مەبەست.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

لە ژیاندا هەندێ شت روودەدەن تا ئێمە بخەنەسەر رێڕەوی
راستەقینەی ئەفسانەی کەسیمان، هەندێ رووداوی تریش
روودەدەن تا بتوانین ئەوەی کە فێری بووین بەکاری
بهێنین، سەرەنجام هەندێ رووداو روودەدەن تا فێرمان بکەن.





کاتێك ئینسان بەرەو ڕووی چارەنووسی خۆی سەفەردەکات، زۆرجار ناچار دەبێت ڕێگاکەی بگۆڕێت. هەندێ کاتیش هێزەکانی دەوروبەری ئەوەندە بەدەسەلاَتن کە ناچارە شەهامەتی خۆی بەلاوەبنێت و تەسلیمی بێت. هەموو ئەمانە بەشێکن لە سەردەمی کارفێربوون.

❧ ❧ ❧

ڕۆحی جیهان بەشێکە لە ڕۆحی خواوەند و ڕۆحی خواوەندیش ڕۆحی خودی ئێمەیە.

❧ ❧ ❧

خۆت لە بڕیارە لەعنەتییە پێشوەختەکان ڕزگارکە، لە پێویستیی دۆزینەوەی ڕوونکردنەوە بۆ هەر شتێ، لەو بێچارەییەی تەنها دەبێت کارێکبکەین کە ئەوانی تر پەسەندی بکەن.



هێندە بەسە لە دەنکەلمێك بڕوانیت و هەموو عاجبایەتییەکانی بوونەوەری تێدا ببینیت.

❧ ❧ ❧

مەرگ هاوڕێی هەمیشەیی ئێمەیە و، ئەوە مانای حەقیقی بە ژیانمان دەبەخشێت.

❧ ❧ ❧

ڕازی خۆشبەختی ئەوەیە هەموو سەرسووڕهێنەرییەکانی جیهان لەبەرچاوبگریت و هەرگیز پەیام و ئامانجی خۆت لە یادنەکەیت.

بڕیارەکان تەنها سەرەتای دەستپێکردنی ماجەرایەکن، کاتێ مرۆڤ بڕیارێك دەدات لە ڕاستیدا هەڵدەدرێتە نێو تەوژمێکی بەهێزەوە و، بۆ شوێنێکی دەبات کە لە کاتی بڕیاردانەکەیدا تەنانەت لە خەویشیدا نەیبینیوە.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

ئەوانەی خۆیان بە دانا دەزانن زۆر جاران لە کاتی فرماندانداندا دوودڵ دەبن و، لە کاتی گوێڕایەڵیشدا یاخین.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

گەورەترین درۆی جیهان ئەمەیە: لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا دەسەڵاتمان بەسەر ژیانی خۆماندا نامێنێت و لەوەودوا چارەنووس دەبێتە دەسەڵاتداری ژیانمان.



ئەوەی خۆی بە لێوڕێژ لە تەقوا بزانێت ئیفلیج دەبێت، ئەوەش کە خۆی بە لێوڕێژ لە گووناه بزانێت ئیفلیج دەبێت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

چاکە و خراپە یەك ڕووخساریان هەیە، هەموو شتێك بەوەوە بەندە کە هەر یەکەیان کەی دێنە سەر ڕێگەی ئینسان.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

لە بەرامبەر هەموو ئەو شتانەی لەم دونیایەدا ڕوودەدەن بەرپرسیارین، ئێمەین جەنگاوەرانی نوور: بە هێزی عەشق و ئیرادەمان دەتوانین چارەنووسی خۆمان و زۆر خەڵکی تریش بگۆڕین.





ئەوەی هەبوە هەمان ئەو شتەیە کە دەبێت، ئەوەش ڕوویداوە هەمان ئەو شتەیە کە ڕوودەدات و لە ژێر هەتاودا هیچ شتێك تازە نییە.

---

تەنها کاتێك ڕاستییەك قبووڵدەکەین کە سەرەتا لە ناخی ڕۆحمانەوە ئینکاریمان کردبێت.

---

غروور دەتوانێت بزوێنەرێکی باش بێت، پارەش دەتوانێت بەڵام نابێت هەرگیز بە ئامانجیان بزانین.



ئەگەر گوێ بۆ بانگی دڵمان بگرین، لە بەرامبەر ڕازی ژیاندا سەرمان دەسووڕمێ، دڵمان بەڕووی موعجیزەکاندا کراوەیە و لە کارەکانی خۆماندا هەست بە شادی و شەیدایی دەکەین.

---

بۆ ئەوانەی بە دوای زمانی جیهانیدا دەگەڕێن دلێری گرنگترین بەهرەیە.

---

هەندێ لە خەڵکی هەن کە بە هەڵەکانیان عادەتدەگرن و پاش ماوەیەك ئەم هەڵانەی خۆیان لەگەڵ پێوەرە ئەخلاقییەکاندا لێتێکدەچێ و ئەو کاتەش ئیتر بۆ گۆڕانی ژیان گەلێك درەنگ بوە.

بەم شێوەیە پارێزگاریی لە نەریت دەکرێت: ئەو کاتەی کە خەڵکی دەتوانن بۆخاتری بیروباوەڕێك بمرن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەنجامدانی کارێکی ئارامبەخش پێش بڕیارێکی گرنگ لە ژیاندا، هەمیشە باشە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەگەر رابردوویەکت هەیە بێزارت دەکات، هەر ئێستا فەرامۆشیکە، بەسەرهاتێکی تازە بۆ ژیانت دروستکە و ئیمانت پێی هەبێت.



وشە جوانەکان هیچ مانایەکیان نییە، ئەو کاتەی مرۆڤ ئازاردەچێژێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

جەنگاوەری نوور چاودێریدەکات لەکاتی چاودێریدا ئەوە خۆی نییە، پشکۆیەکی گەشە لە رۆحی جیهان. ئەم چرکەساتانە رێگەی پێدەدەن بەرپرسیارێتیی خۆی بدۆزێتەوە و بەپێی ئەوە کاربکات. جەنگاوەری نوور دەزانێت کە لە بێدەنگیی دڵیدا رێکوپێکییەك ئامادەیە و رێنوێنیی دەکات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

تەنها ئەو ژن و پیاوانەی کە لە دڵی خۆیاندا مەشخەڵێکی پیرۆزیان هەڵگرتوە دەتوانن بچنە حزووری خودا. تەنها ئەوانن رێگای گەڕانەوە بۆ عەشقی ئەو دەناسن، چونکە تێدەگەن کە کارەسات سزا نییە بەڵکو ململانێیە.





ئەفسانەی کەسی شتێکە کە بەردەوام ئارەزووی ئەنجامدانی دەکەیت.

هەمیشە ئامادەی بینینی ئەو شتانەین کە بوونیان نییە، کەچی لە بەرامبەر ئەو وانە گەورانەی راستەوڕاست لەپێش چاوماندان، نابینایین.

گەر مەراسیمی رۆژانە مرۆڤ کۆنترۆڵبکا، ئەوا دەبێتە بەندەیان و هەموو چەشنە گەشەیەکی ناوەکی یان دەرەکی دەوەستێت.



لە راستیدا هەموو کێشەیەك دوای چارەسەر زۆر ئاسان دەنوێنێت. ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی ئەوڕۆ سادە دەردەکەوێت، بەرهەمی کۆمەڵێك سەرکەوتنی بچووکە کە هەرگیز نەهاتۆتە پێشچاو.

زەین دەتوانێت خاین بێت و وەدووی شتانێك کێشمان بکات کە گەرەکمان نین و بەرەو لای ئەو هەستانەمان بەرێت کە هیچ بەرهەمێکیان بۆمان نین.

ئیبلیس لە شتە بچووکەکاندا نیشتەجێیە.

جنێو بە بەردێك بدە ... كەواتە بە شمشێرەكەت هێرشی
بۆ بەرە ... شمشێرەكەت دەشكێت. باشترین شمشێروەشێن
كەسێكە وەك بەرد وەها بێت، بێئەوەی شمشێر لە كێلان
بێنێتەدەر، نیشانیدەدات كە هیچ كەس ناتوانێت بیشكێنێ.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

رێگای ژیان هەمیشە رێگای نهێنییەكان بوە. فێربوونی
شتێك بە واتای بەرقەراركردنی پەیوەندییە بە جیهانێك،
كە هیچ وێناكردنێكمان بۆی نییە. بۆ فێربوون
لەخۆبووردن پێویستە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئێمە بەرپرسیاری سەرانسەری زەوین، چونكە نازانین
بەشەكانی ترمان كە لە دێرزەمانەوە بوونی ئێمەیان
پێكدەهێنا ئیستێ لە كوێن، گەر باشبن ئەوا ئێمەش
خۆشبەختین ئەگەر خراپبن ئەوا لە بەشێك لەم ئازارە
عەزابدەچێژین.



لەوانەیە عەشق شێوازێكی نەناسراوی جەنگان بێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

كاتێك لە ترۆپكداین هەموو شتێكی تر بە
گچكەیی دەبینین. شانازیی و خەممان مانا
لەدەستدەدەن، هەموو ئەو شتانەی بەدەستمان
هێناون یان لەدەستمان داون هەروەك ئەو خوارە
وەهان. لە لووتكەی كێودا دەبینی كە دونیا چەندە
گەورەیە و ئاسۆكان چەنێ فراوانن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ترس لە ئازار لە خودی ئازار خراپترە و هیچ
دڵێك تا ئەو كاتەی لە سۆراغی خەونەكانیدایە،
هیچ عەزابێك ناكێشێت.

جیاوازییەکی زۆر لە نێوان مەترسی و ترسدا هەیە، بە هەڵە لێت تێکنەچن.

ئیمان فەتحێکی دژوارە و بۆ سەقاگیربوونی پێویستی بە شەڕی رۆژانە هەیە.

عەشق واتە هاوبەشبوون لەگەڵ ئەوی دی لە دونیادا. عەشق واتە روانینە کێوەکان لە گۆشەنیگا جوداکانەوە.



عەشق هیچ نرخێکی نییە، ناتوانرێت مامەڵەی پێوەبکرێت.

کاتێك لە ژیاندا شتێکی گرنگت دەستدەکەوێت، پێویست بەوە ناکات وا گوومانببەی کە دەبێت دەست لە هەموو شتێکی دی بکشێنیتەوە.

ئەو کاتەی بۆ کێشەیەکی نوێ رێگەچارەیەکی نوێ پێویست بێت نەریت شکێنی گوناه نییە، خودا بەخشندەیەکی رەهایە. لە بەرامبەر ئەو کەسانەش کە جوامێریی کارکردنیان نییە تۆڵەسێنێکی قینلەدڵە.

مرۆڤبوون واتە بەگوومانبوون و بەم حاڵەشەوە
بەردەوامیدانە بە ڕێگەی خود.

خۆت نیگەرانی شرۆڤەی هەستەکان مەکە، بە
شەیداییيەکی تەواوەوە بژی و هەموو هەستەکان
وەك بەهرەیەکی خودایی ڕابگرە.

کەسێك کە گوێیەکی بیستەری نییە هەرگیز ئەو
ڕێنوێنیانەی کە ژیان هەموو ساتێك پێماندەڵێت،
نابیستێت.



دەبێت خۆت بخەیتە مەترسییەوە، دەبێت هەندێ
ڕێگە بگریتەبەر و ڕێگەکانی دی وەلابنێیت. هیچ
کەسێك ناتوانێت بێترس شتێك هەڵبژێرێت.

نازانین نەناسراو دەتوانێت خۆشەویست بێت یان
نا، وەلێ گەنجینەی ئێمە لە نەناسراودا
شاردراوەتەوە، گەر نەتوانین پێی بگەین هەمیشە
دەتوانین بگەڕێینەوە ماڵێ.

پیاو دەبێت بەهایەك بدا: دەبێت یەکەم
هەنگاوبنێت، چونکێ ژن بەهایەکی زیاتر دەدات:
تەسلیمبوون.





ئەگەر كەسێك بیەوێت لە شەڕی چاكەدا بجەنگێت، دەبێت جیهان لە شێوەی گەنجینەیەكی گەورەدا ببینێت كە چاوەڕێی كەشف و ژێربارخستنە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

عەشق دەمێنێتەوە، ئەوە مرۆڤەكانن دەگۆڕدرێن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بۆ ئەو شتانەی فەتحكراون، نابێت عەشق ئارەزووی گەڕان بە دوای نهێنییە گەورەترەكاندا لەناوبەرێت.



هەمیشە دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ ژیانی پێشوومان، ئەگەر ئەم بیرۆكەیەمان لە مێشكدا بێت ئەوا جوامێرییەكی زێدەترمان بۆ جێهێشتنی هەموو شتێك و وەدووكەوتنی خەونەكانمان دەبێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بە هیچ شێوەیەك ناتوانرێت ئیمان شرۆڤەبكرێت، شەوێكی تاریكە، تەنها دەتوانرێت قبووڵبكرێت یان قبووڵنەكرێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

جەنگاوەر ناهێڵێت لە كاتی گەڕان بەدوای خواستەكەیدا ترس بەسەریدا سەربكەوێت. بەبێ عەشق ئەو هیچە.





به دێوانەیی بمێننەوە بەڵام وەك عاقڵان ڕەفتاربكەن، مەترسیی جیاوازبوون قبووڵبكەن، وەلیّ فێربن کە بیّ سەرنجڕاكێشان جیاوازبن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

دەبێت متمانەمان بەو پانتاییە هەبێت، کە هەر کەس بۆ فێربوونی خۆی هەیەتی.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

کاتێك کەسێك ڕێگاکەی هەڵبژارد نابێت بترسێت، دەبێت بۆ هەڵگرتنی هەنگاوە هەڵەکان جوامێریی پێویستی هەبێت. نائومێدییەکان، شکستەکان و دڵساردییەکان ئەو هۆکارانەن کە خودا بۆ نیشاندانی ڕیّ بەکاریان دەهێنێت.



جەنگاوەری نوور دەزانێت کە شەڕەکانی پێشووی هەمیشە شتێکیان بۆ فێربوون تێدا بوە. چەندەها جار کاتی خۆی بۆ شەڕ بۆخاتری درۆیەك بەهەدەرداوە و بۆ کەسانێك عەزابی چەشتوە کە شایەنی عەشقی ئەو نەبوون. سەرکەوتوان هەرگیز هەڵەیەك دووبارەناکەنەوە، هەر لەبەرئەمەشە جەنگاوەر تەنها دڵی وەخاتر شتێك دەخاتە مەترسییەوە کە بەهای ئەوەی هەبێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەندیّ چرکەسات هەن جگە لە غەم و عەزاب هیچ شتێك ڕوونادات و ناتوانین خۆمانی لێبدزینەوە، تەنها ئەو حەلە هۆکاری بوونیان تێدەگەین کە بەسەریاندا زاڵ بووبێتین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

دونیا دەگۆڕدرێت و ئێمە بەشێکین لەم گۆڕانکارییانە. فریشتان ئێمە ڕێنوێنی و دەپارێزن.





عەشق هێزێکە جارێکی تر ئێمە پێکەوە گرێدەداتەوە، تا ئەو ئەزموونەی لە ژیانە جیاجیاکان و لە شوێنە جیاوازەکانی جیهاندا بلاّوبۆتەوە جارێکی تر کەڵەکە بێت.

بۆ جەنگاوەری نوور عەشقی مەحاڵ بوونی نییە، ئەو تەمێی بێدەنگی، بێباکی یان سەرکووتکردن نابێت، دەزانێت کە لەودیو رووکاری سەهۆڵینی مرۆڤانەوە دڵێك لە ئاگر بوونی هەیە.

ئەوەی کە وا بزانیت لەسەر رێی راستی، شتێکە. بەلاّم ئەوەی کە وا بیربکەیتەوە رێی راست هەر ئەمەیە شتێکی ترە. هەرگیز ناتوانین سەبارەت بە ژیانی ئەوانی تر داوەریبکەین، چونکە هەر کەسێ گۆڕانکاریی خۆیی هەیە.



ئەمە دژوارترین ساتەوەختی ژیانی مرۆڤە... کاتێك مرۆڤ شەڕی چاکە دەبینێت و ناتوانێت خۆی حازرکا و بڕوات بۆ شەڕ.

هۆشیاریی لە مردن ناهێڵێت ئەوەی ئەوڕۆ دەبێت چێژی لێ وەربگرین، بۆ سوبحەینێی دوابخەین.

گوێ بۆ بانگی دڵت بگرە، دڵت هەموو شتێك دەزانێت چونکە رۆحی جیهان دەبینێت و رۆژێك بۆ لای دەگەڕێتەوە.





ئاساییه بترسیت له گۆڕینەوەی هەموو ئەو شتانەی بەدەستت هێناون بە خەونێك، بەڵام مەترسێ.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

له شادیدا هیچ گووناهێك نییە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

خۆ له خەڵکی بەخراپتر زانین یەکێکە له بێبەزەیییانەترین کارکردەکانی غروور، چونکە هەروەك وێرانکەرترین شێوەی جیاوازبوون بەکاردەهێنرێت.



ناتوانین چاکە چڕبکەینەوە، هێزی چاکە هەمیشە وەکو نوور پەراگەندە دەبێت. کاتێك شەپۆلێك له پرشنگی چاکە پەرشدەکەیتەوە سوود بە جۆری بەشەر دەگەیەنیت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

تەواوی ئەم دونیایە پیرۆزە، دەنکێك لەم دەتوانێت پردێك بێت بەرەو رووی جیهانی نەبینراو.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بەهۆی ترسی لەدەستدانەوە چەندان شتمان لەدەستداون.

بە شێوەیەکی ئاسایی مەرگ دەبێتە هۆی ئەوەی، مرۆڤ زیاتر ژیان هەستپێبکات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

لە کاتی ڕوودانی کارەساتدا، ئەوەی کۆن بوە دلێران دەیخەنە نێو ئاگرەوە، تەنانەت بە بەهای عەزابی ناوەکی گەورەش هەموو شتێك دەخەنەلاوە و دەڕۆنەپێش. دلێران هەمیشە سەرسەختن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

مەعریفە بەبێ گۆڕانکاری، دانایی نییە.



گەڕان دەتوانێت هێندەی دۆزینەوە خۆش بێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ژیان بۆ ئەو کەسەی وەدووی ئەفسانەی کەسی خۆی دەکەوێت، سەخاوەتمەندە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

خوداوەند لە دەستەکانی هەر کەسێکدا بەهرەیەك یان هۆکارێکی بۆ دەرکەوتن لە جیهان و یارمەتیدانی مرۆڤایەتی، داناوە.





مرۆڤ دەبێت ئەوە فێر بێت کە پێویستە، نەك تەنها ئەو شتەی خۆی دەیەوێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

جەنگاوەری نوور هاوکات پێویستی بە ئارامگری و خێرایییە.
گەورەترین هەڵەکانی نەخشەیەکی جەنگی کاری پێشکاتە یان راڕایی و لەدەستدانی فرسەت، بۆ دوورکەوتنەوە لەمە جەنگاوەر هەر شوێنگەیەك بە تاکانەیی لەبەرچاودەگرێت و پەیڕەوی لە رێسا و رەچەتە و بیروبۆچوونی خەڵکانی دی ناکات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

جەنگاوەری نوور بێئەوەی بیەوێت هەنگاو بە هەڵە دەنێت و دەکەوێتە نێو چاڵەوە و کاتی گەڕانی بە شەڕی چاکەدا بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەگەری ڕوودانی وەها کارەساتێك بەسەریدا ئامادەیە، وەلێ ئەم کارەساتە ڕوودەدات. ئەو کاتەی غەرقی تاریکییە لەگەڵ مامۆستاکەیدا قسەدەکات: (( مامۆستا کەوتمە نێو چاڵەوە. ئاوەکان قووڵ و تاریکن.)) مامۆستا وەڵامدەداتەوە: (( شتێك بەبیربهێنەرەوە، ئەویش ئەوەیە: ئەوەی کەسێك دەخنکێنێت کەوتنە ناو ئاو نییە، بەڵکو لەژێر ئاودا مانەوەیە.)) جەنگاوەری نوور هێزی خۆی بەکاردەهێنێت بۆ دەرچوون لەم شوێنە تاریکە.
تەنها کاتێك موعجیزەی ژیان بەڕاستی درکپێدەکەین کە بهێڵین پێشبینینەکراو ڕووبدات.



مانای راستەقینەی عەشق لە گوڵەکاندا شاردراوەتەوە.
کەسێك هەوڵبدات ببێتە خاوەنی گوڵێك، ژاکانی جوانییەکەشی دەبینێت، بەڵام ئەگەر هەر بەوەندەوە بوەستێت کە گوڵێك لە دەشتێکدا ببینێت هەمیشە لەگەڵیدا دەمێنێتەوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

رازی هەر سەرکەوتنێك سادەترین شتی جیهانە: بزانین لەگەڵیدا چی دەکەین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

رەوایە مرۆڤ شکی لە پەیامی خۆی هەبێت و هەندێجاریش وازی لێ بهێنێت، بەڵام لەبیربردنەوەی رەوا نییە. بێئەرزشە ئەوەی گوومان لە خۆی نەکا و کوێرانە بە توانایی خۆی ئیمانی هەیە، چونکە گووناهی گەورە دەستەویەخەیەتی.





مرۆڤ سەرچاوەکەی خۆی لەیاددەباتەوە، بەڵام هەرگیز سرووشت خۆی لەیادناکات.

ଓଃ ଓଃ ଓଃ
ଓଃ ଓଃ ଓଃ

مەسەلە سادەکان هەمیشە لەڕادەبەدەر ئاڵۆز دەردەکەون.

ଓଃ ଓଃ ଓଃ
ଓଃ ଓଃ ଓଃ

سەرانسەری گەڕانی ئێمە کارێکە کە دەرەنجامی ئیمانە.



گرنگ ئەوەیە خاك هەمیشە بەکێڵراوی و شەپۆل کەفاوی و هەستەکان لە بزواندا بهێڵێتەوە. سەرانسەری جیهان لەجووڵەدایە؛ ناتوانین بەجێبمێنین.

ଓଃ ଓଃ ଓଃ
ଓଃ ଓଃ ଓଃ

ئەو کاتەی عەشق دەکەین، هیچ پێویستمان بە درككردنی ئەوەی کە ڕوودەدات نییە، چونکە هەموو شتێك لە ناخی ئێمەدا ڕوودەدات.

ଓଃ ଓଃ ଓଃ
ଓଃ ଓଃ ଓଃ

کەسێك کە دەست لە چارەنووسی ئەوانی تر وەردەدات، هەرگیز چارەنووسی خۆی نادۆزێتەوە.

شمشێر بە چ دەردێك دەخوات گەر نەزانیت لەکوێدا دوژمنت دەدۆزیتەوە.

کاتێ ژمارەیەکی دیاریکراوی مرۆڤان کامڵدەبن، تەواوی جۆری مرۆڤ بە کامڵبوون دەگات.

مرۆڤەکان هەمیشە لە چرکەساتێکی گوونجاودا دەگەنە شوێنێ کە چاوەڕێیان دەکەن.



جەنگاوەری نوور ئەگەر ئیمانی لەدەستبدات دیسانەوە بەردەوام دەبێت، لە بەرەوپێشچووندا ئیمان بە زیندووی دەمێنێتەوە.

تەواوی جەنگەکانی ژیان شتێك فێری ئێمە دەکەن، تەنانەت ئەو شەڕانەش کە بە شکستی ئێمە کۆتاییان دێت.

هەرگیز عەشق مرۆڤ لە خەونەکانی جیاناکاتەوە.





گەڕان بەدوای خۆشبەختیدا شتێکی شەخسییە و ناتوانرێت لەم ڕێیەدا خەڵکانی دی بکرێنە سەرمەشق.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت دەستبەرداری خەون ببێت. خەون خۆراکی رۆحە، وەکی چۆن خواردن خۆراکی جەستەیە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

تۆ بەشی خۆت جێبەجێبکە و نیگەرانی بەشی خەڵکی مەبە، دەتوانیت دڵنیا بیت کە خودا لەگەڵ ئەوانیش قساندەکا و ئەوانیش وەکو تۆ سوورن لەسەر دیتنەوەی مانای ئەم ژیانە.



بە ئینکاریکردنی خەونەکانمان و گەیشتن بە ئارامی دەچینە خوولێکی کورتی ئاسوودەیییەوە، بەلاّم وردەوردە خەونە مردوەکان لە ناخماندا دەپووکێنەوە و سەراپای ژیانمان دەگەنێنن و لەگەڵ مرۆڤەکانی دەوروبەرماندا بێڕەحم دەبین، دواتر ئەم بێڕەحمییە ئاراستەی خۆمان دەکەین: لێرەدا نەخۆشییەکان و پەرێشانییە دەروونییەکان سەرهەڵدەدەن. ئەوەی کە هەوڵماندەدا لە جەنگدا لێی هەڵبێین- نائوومێدی و شکست لە ئەنجامی ترسنۆکییەوە- بەسەرماندا دێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

کارەساتێك لەئارادا نییە تەنها موتڵەق بوونی هەیە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

لە راستیدا ئەوە بوونەوەرەکان نین کە شتێك ئاشکرادەکەن، خوودی خەڵکین بە روانینە بوونەوەرەکان شێوازی چوونە نێو رۆحی جیهان دەدۆزنەوە.





هەڵە جیهان دەخاتە جووڵەوە، هەرگیز لە هەڵە مەترسە.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

هەر کارێك مرۆڤ دەیکات، ئەگەر دڵی سەرڕێژبێت لە عەشق، دەتوانێت بە حیکمەتی باڵای بگەیەنێت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

هیچ کەس بە چاوی داخراوەوە ناگاتە ئامانج.



هەندێ کەس شەیدای دروستکردنی جیهانێکن کە هیچ مەترسییەکی دەرەکی توانای زەفەرپێهێنانی نەبێت، دیواری بەرگریی زۆر بڵند لە بەرامبەر جیهانی دەرەوە، لەبەرامبەر کەسانی نوێ و شوێنگەی نوێ و ئەزموونە نوێیەکاندا هەڵدەچنن و جیهانی ناوەکی خۆیان بە رووتی جێدەهێڵن.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

ژیان نەك لە ئارەزووەکان بەڵکو لە کردەوەکانی هەر مرۆڤێك دەخولقێت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

تەنها شتێك دونیا پێویستییەتی، نموونەی کەسانێکە کە دەتوانن خەونەکانی خۆیان بهێننەبوون و بۆ بیروباوەڕەکانیان بجەنگن.





جەنگان فێردەبین بەڵام جوامێریی چوونە نێو شەڕمان نییە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

عەشقی راستەقینە هەوڵدان بۆ راستکردنەوەی خەڵکانی دی نییە. خۆشحاڵی لەوەوەیە کە ببینیت هەموو شتێك باشتربوە لەوەی چاوەڕێمان دەکرد.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

تەنهارێی رزگاربوونی خەونەکان، میهرەبانییە لەگەڵ خۆدا.



هەمیشە باشترین رێگە بۆ پێوان دەبینین، کەچی رێگایەك دەپێوین کە عادەتمان پێوەی گرتوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەندێجار لە کاتێکی کورتی هێندەی هاوارێکی سادە، هەموو شتێك لە ژیاندا ژێراوژوور دەبێت، بەرلەوەی مرۆڤ بتوانێت خوی پێوەبگرێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بۆ باشتربوونی هەموو شتێك، دەبێت بزانین چیمان دەوێت.

لەوەی کە دەیکەیت بەدوای عەشقدا بگەڕێ و، لە
بەرهەمەکەی خۆتدا تەجلای پێببەخشە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەگەر تەنها بیت هیچ بەرهەمێکی نییە کە سەرانسەری
جیهان درکپێبکەیت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

(منی راستەقینە چییە؟) لە شاراوەییدا هەر ئەوەیت کە
هەیت، نەك ئەوەی ئەوانی دی تۆیان لێ دروستکردوە.



جەنگاوەری نوور حەریفەکانی خۆی هەڵدەبژێرێت، کاتی
خۆی بە بیستنی هاندان بەهەدەرنابات. ئەو دەبێت
چارەنووسی خۆی دەستەبەربکات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بێئیمانی دەتوانێت ببێتە هۆی دۆڕان لە یارییەکدا کە لە
سەرکەوتن نزیکبووبێتینەوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

مرۆڤان دونیا هەر بەو شێوەیە دەبینن کە حەزدەکەن وا
بێت، نەك بەو شێوەیەی هەیە.

جیهانی بێگانە بوونی نییە، جیهانی تازە بوونی هەیە.

قسەکردن دەربارەی عەشق پێویست نییە، چونکە عەشق ئاوازی خۆی هەیە و خۆی قساندەکات.

ڕێگای ڕاستکردنەوەی گووناه هەمیشە بەرەوپێشچوونە، خۆگوونجاندنە لەگەڵ هەلومەرجە نوێیەکاندا و لەبەرامبەر ئەمەدا وەرگرتنی هەزاران بەرەکەتە، ئەو بەرەکەتانەی ژیان سەخاوەتمەندانە بەوانەی دەبەخشێت کە بەدوایدا دەگەڕێن.



وشە بیرۆکەیەکی گۆڕاوە بۆ بڵندی، هێزێکی گەورەتر لەهەموو ڕێوڕەسمەکانی هەیە.

هەندێ کات ئەوەندە نیگەرانی گەیشتنین، تەنانەت گرنگترین شت لەبیردەکەین. دەبێت بجوولێین تا دەگەین.

ڕێگای ڕاستەقینەی حیکمەت دەکرێت بە سێ شتدا بناسرێتەوە. یەکەم: دەبێت هانی عەشق بدات. دووەم: دەبێت لە ژیاندا کارکردی پراکتیکیی هەبێت. سێهەم: هەموو کەسێك دەبێت بتوانێت ئەم ڕێیە ببڕێت.

رووخسەتمان هەیە کە لە ژیاندا هەڵەگەلێکی زۆر بکەین، جگە لەو هەڵەیەی لەناومان دەبات.

هەمیشە ئاسانترە کە مرۆڤ بڕوای بە چاکەی خۆی هەبێت، تا لەگەڵ خەڵکانی تردا رووبەڕووبێتەوە و بۆ بەدەستهێنانی مافی خۆی بجەنگێت.

با لە چرکەساتی ئاشتیدا رێگای ئێمە ئاشتی و لە چرکەساتی شەڕدا رێگای ئێمە شەڕ بێت. هەرگیز چرکەساتێك بە چرکەساتێکی تر بە هەڵە لێمان تێکنەچن.



خوداوەند پەروەردگاری دلێرانە، چونکە دلێران کەسانێکن دەترسن وەلێ بڕیاردەدەن، لە هەر هەنگاوێکی رێگادا گوومانیان هەیە و لەگەڵ ئەمەشدا کاردەکەن.

جەنگاوەری نوور هەروەك شەڕکەرێك هێزی گەورەی خۆی دەناسێت، هەرگیز لەگەڵ کەسێکدا کە شایەنی شەڕی ئەم نییە، ناجەنگێت.

لە نێوان هێڵەکانی هەموو داستانەکانی عاشقاندا کابووسی جوودایی شاردراوەتەوە، هەرچەندە ئەم دابڕانە هەرگیز روونادات، بەلاّم تا ئەو کاتەی عەشق بوونی هەیە ترس لە فیراقیش ئامادەیە.





له دونیادا هیچ شتێكى تەواو هەڵە نییە. تەنانەت كاتژمێرێكى وەستاویش دەتوانێت دووجار لە رۆژێكدا بە درووستى كات نیشانبدات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەموان ناتوانن بە یەك شێوە خەون ببینن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەمیشە دەبێت بزانیت كە چیت دەوێت.



هەر بەرەكەتێك قبووڵنەكرێت دەگۆڕدرێت بۆ نەگبەتى.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

تەنها لە رێگەى فێركردنەوە، فێردەبیت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەموو شتێك رێگەپێدراوە، جگە لە رێگەگرتن لە دەركەوتنى عەشق. لێرەدا هەر كەسێك ببێتە رێگرى دەركەوتنى عەشق دەشبێتە بەرپرسیارى دووبارە ئافراندنەوەى.

عەشق تەنها بە عاشقبوون دەدۆزرێتەوە نەك بە وشەکان.

دڵی تۆ هەمان ئەو شوێنەیە کە گەنجینەکەتی لێ شاردراوەتەوە.

جەنگاوەری نووری خاوەنپەیمان کەسێك نییە کە باری دونیای خستبێتە سەر پشتی، کەسێکە کە ململانێکردن لەگەڵ کێشەکانی هەر چرکەساتێکدا فێردەبێت.



کات شتێك نییە هەمیشە بە یەك شێوە تێپەڕێت، ئەوە ئێمەین، خێراییی تێپەڕبوونی کات دیاری دەکەین.

بێ تێگەیشتنی ئەوەی کە پێویستمان بە هەموو کەس و هەموو شتێك هەیە جەنگاوەرانێکی لەخۆباییین، لەخۆباییبوونمان دواجار بە شکستمان دەبەن، چونکە ئەوەندە لە خۆمان دڵنیاین کە لە مەیدانی شەڕدا چاڵوچۆڵییەکان نابینین.

لە دێرزەمانەوە مرۆڤەکان هەوڵیانداوە لەرێگەی عەشقەوە جیهان درکپێبکەن.





هیچ گووناهێك جگە لە لەدەستدانی عەشق بوونی نییە.

مرۆڤەکان بۆ دوو گرووپ دابەشدەبن: ئەوانەی دروستدەکەن و ئەوانەی دەنێژن. ئەوانەی دروستدەکەن لەوانەیە ساڵیانێکی درێژ لە دۆخی خۆیاندا بمێننەوە و کارەکەیان چەندان ماوە درێژەبکێشێت، بەڵام رۆژێك تەواو دەبێت. لەم کاتەدا دەوەستن و لەنێوان ئەو دیوارانەی خۆیان دروستیان کردوە گەمارۆدەدرێن، وەختێ کاری دروستکردن بە کۆتادەگات ژیان مانای خۆی لەدەستدەدات. وەلێ ئەوانەی دەنێژن هەندێجار لەکاتی تۆفان و گۆڕانی وەرزەکاندا عەزابدەچێژن و هەندێجار ماندوو دەبن، بەڵام باخێك بەپێچەوانەی ئاپارتمانێکەوە هەرگیز لە گەشە ناکەوێت.

هەڕەشە ئەگەر قبووڵنەکرێت بە هیچ شوێنێك ناگات.



هەرگیز مەهێڵە شك و گوومان چالاکییەکانت ئیفلیجبکەن. هەمیشە ئەو بڕیارانە بدە کە پێت وایە پێویستن، تەنانەت ئەگەر لە دروستیشیان دڵنیانیت.

کەم خەڵك هەن کە پۆشاکی سەرکەوتنی خۆیان قبووڵدەکەن، زۆرینەی خەڵکی رێك لەو کاتەی دەستەبەربوونی خەونەکانیان نزیکە، کۆڵدەدەن.

شەیتان لە سێ رێگاوە مرۆڤ تاقیدەکاتەوە: هەڕەشە، بەڵێن و هێرشکردن بۆ خاڵی لاوازی ئەو.

هەموو شتێکی تازە ئازاردەرە، ژیان غافلگیرمان دەکا و ناچارمان دەکات بەرەو نەناسراوەکان بڕۆین، تەنانەت ئەو کاتەش کە نامانەوێ و پێویستمان بەم کارە نییە.

* * *

وتووێژ زۆر دلگیرە، بەتایبەت ئەو کاتەی دەمانەوێت خۆمان سەبارەت بەو شتەی دەیلێین باوەڕدار بکەین.

* * *

مرۆڤ دەبێت هەڵبژێرێت، هێزی ئەو لەمەدا شاردراوەتەوە: دەسەڵاتی هەڵبژاردن.



جەنگاوەری نوور بۆ ئەوەی ئیمانی بە ڕێبازەکەی خۆی هەبێت، پێویست نییە بیسەلمێنێت کە ڕێگەکانی تر هەڵەن.

* * *

سەرسەختی ئاسانە. تەنها کارێك کە پێویستە دوورییە لە خەڵکی و بەم شێوەیەش خۆ دوورگرتنە لە ئازار، لەم حاڵەتەدا پێویست نییە کە مەترسیی عەشق، نائوومێدی و خەونە لەبارچووەکان بە گیان بکڕین.

* * *

ئێمە هەموومان وەڵامەکان دەزانین، تەنانەت پێش ئەوەی کەسێك دەربارەیان قسەمان بۆ بکات. ژیان هەر ساتەوەختێك کۆمەڵێك وانەمان فێردەکات و رازەکەی ئەوەیە کە قبووڵی بکەین. تەنها بە ژیانی رۆژانەی خۆمان دەتوانین بە حیکمەتی سوولەیمان و بە هێزی ئەسکەندەری گەورە بگەین.





خودا گەورەترین دیارییەکانی خۆی داوە بە رۆڵەکانی:
دەسەڵاتی هەڵبژاردن و دیاریکردنی کرداری خۆ.

هەستەکان دەبێت هەمیشە ئازادبن. نابێت بە عەزابی
رابردوو دەربارەی عەشقی نوێ بڕیاری پێشوەختە
بدرێت.

کەوتنەخوارەوە لە نهۆمی سێهەمەوە هەر هێندەی
کەوتنەخوارەوە لە نهۆمی سەدهەمەوە زیانبەخشە. گەر
بڕیارە بکەوینە خوارەوە با لە بڵندترین شوێنەوە
بکەوینە خوارەوە.



جەنگاوەری نوور هەمیشە خاوەنپەیمانە و بەندەی
خەونی خۆیەتی، بەڵام هەنگاوەکانی بە ئازادی
دەهێڵێتەوە.

هەرگیز نابێت ئارامبگریت، تەنانەت ئەگەر رێیەکی
درێژیشت تەیکردبێت.

ترس تەنها تا ئەو شوێنە بوونی هەیە کە
شوێنگەیەکی حەتمی دەستپێدەکات، لەوە بەدوا مانای
خۆی لەدەستدەدات. ئەوەی تەنها بۆ ئێمە دەمێنێتەوە
ئەو ئومێدەیە کە بڕیاری درووستمان دابێت.

هەموو مرۆڤێك لەسەر زەویدا گەنجینەیەكی هەیە كە چاوەڕێی دەكات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

شەیدایی هێزێكی گەورەی هەیە، دەتوانێت لە سەركەوتنی كۆتاییدا یارمەتیمان بدات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

لە ژیاندا هەموو شتێك دەبێت كاركردی پراكتیكیی هەبێت، بەپێچەوانەوە حیكمەت دەگۆڕدرێت بۆ شتێكی بێئاكام و گەندەڵ، بەوێنەی شمشێرێك كە هەرگیز بەكارنایەت.



هەر گەڕانێك بە بەختی تازەكارەكان دەستپێدەكات و بە ئەزموونی پایەداری فاتیحەكان بە كۆتادەگات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

جەنگاوەری نوور ئەوەی دەربارەی رێ دەیزانێت لەگەڵ خەڵكی تردا باسی دەكات، كەسێك كە یارمەتی خەڵكی بدات هەمیشە یارمەتی دەدرێت و دەبێت ئەوەی فێری بووە، فێری خەڵكی تری بكات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

خودا هەمیشە لە ژیاندا هەلێكی دووبارە بە مرۆڤ دەبەخشێت و یارمەتی دەدات تا جارێكی تر رێگەكەی بدۆزێتەوە.

ئێمەین رۆحی جیهان خۆراك پێدەدەین، ئەو زەوییەی لەسەری دەژین باشتر یان خراپتر دەبێت گەر ئێمە باشتر یان خراپتر ببین.

هەموو کەسێك لەسەر رووی زەویدا هەمیشە تەجەللابەخشی بونیادیترین پەیامە لە سەربووردەی جیهان. گرنگ نییە چی دەکات.

تۆفانەکانی بوون هەرگیز بەسەر کەسێکدا سەرناکەون کە دۆستەکانی دەپارێزێت، ئەو هێزی تەواوی بۆ تێپەڕین لە کێشەکان و پێشڕەویکردن، هەیە.



هەموو کەسێك دەتوانێت ئەو شتەی کە دەیەوێت و پێویستییەتی بەدەستی بهێنێت .

تەنها ماندوێتیی تۆبەی خۆت پێشکەش خودا مەکە، شادییەکانیشت پێشکەشکە.

باشترین رێگە بۆ خزمەتکردنی خودا رۆیشتنە بەدوای خەونەکانی خۆدا. تەنها ئەو کەسە دەتوانێت شادی پەرشبکاتەوە کە شاد بێت.

عەشقی حەقیقی بە تێپەڕبوونی کات تازەدەبێتەوە و گەشەدەکا و شێوازگەلی نوێ بۆ دەرکەوتنی خۆی دەدۆزێتەوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

عەشق ترسناکە بەڵام هەمیشە هەروا بوە، هەزاران ساڵە کە مرۆڤەکان بەدوای عەشقدا گەڕاون و دۆزیویانەتەوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

خۆشبەختی هەندێجار بەرەکەتێکە، بەڵام عادەتەن فەتحێکە.



جەنگاوەری نوور زۆر کەم باس لە بەرنامەکانی خۆی دەکات، دەزانێت کە هەر جارێك قسان لە خەونێك دەکات بەشێك لەهێزی ئەم خەونە لە دەرکەوتنیدا سەرفدەکا و، بە قسەکردنی دووبارە لە خەونێك هێزی پێویست بۆ کار دەخاتە مەترسییەوە. جەنگاوەری نوور دەسەڵاتی وشەکان دەناسێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەگەر گوێ بۆ ئەو منداڵە بگرین کە لە رۆحی خۆماندا هەیە، چاوانمان وەدرەوشانەوە دەکەون. ئەگەر پەیوەندیمان بەم منداڵەوە لەدەستبدەین، پەیوەندیمان لەگەڵ ژیاندا لەدەستدەدەین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

جەنگاوەری نوور دەزانێت کە لە هەڵبژاردنی ئەوەی دەیەوێت ئازادە، دلێرانە بە سەربەخۆیی و هەندێجاریش بە کەمێك سەرشێتییەوە بڕیارەکانی دەدات.





منداڵ هەمیشە دەتوانێت سێ شت فێری گەورەکان بکات: بێهۆکار خۆشحاڵبوون، هەمیشە سەرگەرمی بە کارێکەوە، بەوپەڕی تواناوە دەربڕینی خواستەکانی خۆی.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

کاتی خواردن بخۆ و کاتی جوولە بجووڵێ.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی ئەورۆ ئاسان دەنوێنی، بریتییە لە زنجیرەیەك سەرکەوتنی چکۆلە کە بێئەوەی درکیان پێبکرێت، روویانداوە.



هەڵەیەك دووجار مەکە، هەرگیز ئامانجی ژیانی خۆت لەبیر خۆت مەبەرەوە.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

کاتێك لە ناخی دڵتەوە شتێکت بوێت، لە رۆحی جیهان نزیکتری. رۆحی جیهان هەمیشە هێزێکی پۆزەتیڤە.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

راکردن لە شەڕ خراپترین شتێکە کە رەنگە رووبدات، خراپترە لە شکست لە جەنگدا چونکە هەمیشە دەتوانین لە جەنگەوە شتێك فێرببین، وەلێ ئەگەر رابکەین تەنها سەرکەوتنی دوژمنمان راگەیاندوە.





ئەگەر دەتەوێت شتێك فێرببیت، تێیدا نغرۆبە.

دەتوانیت شوێنگەی خۆت هەڵبژێریت، بەڵام پاش هەڵبژاردن دەبێت بەتەواوی بوونتەوە لەوێ بیت. قەڵەمڕەوێکی پارچەپارچەبوو بەرامبەر هێرشی دوژمن خۆی ڕاناگرێت، مرۆڤێکی پارچەپارچەبوو ناتوانێت بە پتەوییەوە لەگەڵ ژیاندا ڕووبەڕووببێتەوە.

عەشق نووری جیهانە و تاریکیی نەناسراوەکان.



هەمیشە کەسێك لە جیهاندا هەیە، چ لە ناوەڕاستی بیابان و چ لە شارێکی گەورەدا، چاوەڕێی ئەوی تر دەکات. ئەو کاتەی ئەمانە بەریەکدی دەکەون و نیگاکانیان لەیەکدەدەن، سەرانسەری ڕابردوو و داهاتووش گرنگیی خۆیان لەدەستدەدەن و تەنها هەر ئەو چرکەساتە بوونی دەبێت.

ڕێگای ڕۆحانی دوو ئەزموونی هەیە: ئارامگری و چاوەڕێکردنی چرکەساتی مژدەپێدراو، جوامێریی فریونەخواردن بە بینراوەکان.

بەس ئەو کەسەی کە گوومان لەخۆ نەکات شایان نییە، چونکە کوێرانە پشت بە تواناکانی دەبەستێت و دووچاری گووناهی لەخۆباییبوون دەبێت. پیرۆزی بێت ئەو کەسەی هەندێجار دووچاری گوومان دەبێت.





خەڵكێكی زۆر شەیدای شتە بچووكەكانن و فەرامۆشی دەكەن كە بەدوای چییەوەن.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

خواوەند ئەو رێگایەی كە هەر ئینسانێك دەبێت بیپێوێت، لە جیهاندا نووسیوە.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

هەموان لە سەرەتای لاویدا دەزانن كە ئەفسانەی كەسییان چییە. لەو سەردەمەی ژیاندا هەموو شتێك رۆشنە و هەموو شتێك دەشێت و مرۆڤ لە خەون و ئارەزووی ئەو شتەی دەیەوێت لە ژیاندا ئەنجامی بدات ناترسێت، لەگەڵ ئەمەدا بە تێپەڕبوونی كات هێزێكی مانادار دەكەوێتەگەڕ و هەوڵی خۆی دەخاتەكار بۆ سەلماندنی ئەوەی كە دەستەبەربوونی ئەفسانەی كەسی مەحاڵە.



تەنها مرۆڤێك كە شەرم لە خۆی ناكات، دەتوانێت شكۆی خواوەند موتەجەللی بكات.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

جەنگاوەری نوور دەزانێت كە هەموو شتێك لە دەوروبەریدا - سەركەوتنەكانی، شكستەكانی، شەیدایی و نائومێدییەكانی - بەشێكن لە شەڕی چاكە. جەنگاوەر نایەوێت جێگیر بێت، ئەو هاوژیانی لەگەڵ دوالیزمەكانی خۆی فێر دەبێت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

جەنگاوەری نوور ئیمانی هەیە، لەو رووەوە كە ئیمانی بە موعجیزەكان هەیە موعجیزە روودەدات. لەو رەوەوەی دڵنیایە كە بیركردنەوەی ئەو دەتوانێت ژیانی بگۆڕێت، ژیانی دەگۆڕێت، لەبەرئەوەی یەقینی هەیە عەشق دەدۆزێتەوە و بە عەشق دەگات.

داناییان دەزانن کە جیهانی سرووشتی تەنها وێنە و نووسراوێکە لە فێردەوس. حەقیقەتی سادەی بوونی جیهان، گرەنتیدەری بوونی جیهانێکی کامڵترە.

خودا لە حیکمەتی ڕەهایدا دۆزەخی لە ناوەڕاستی بەهەشتدا شاردۆتەوە، تا بۆ هەمیشە سەرنجبدەین.

ئەو ئەسپسوارەی لە ئەسپەکەی دەکەوێتە خوارەوە، ئەگەر یەکسەر سواری ئەسپەکەی نەبێتەوە ئیدی ئازایەتیی بۆ ئەم کارەی نامێنێت.



لە لاوێتیدا زۆر دلێرین بەڵام هێشتا فێری جەنگان نەبووین ... بە هەوڵی زۆر فێری جەنگان دەبین وەلێ لەو کاتەدا ئیدی جوامێریی چوونەناو جەنگمان نییە، کەواتە لە خۆمان هەڵدەگەڕێینەوە و شەڕەکە لەناو خودی خۆماندا هەڵدەگیرسێنین و خۆمان دەبینە خراپترین دوژمنی خۆمان.

یەکەمین نیشانەی پرۆسەی کووشتنی خەونەکانمان کەمبوونی کاتە. مرۆڤە پڕکارەکان هەمیشە کاتی پێویستیان بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك هەیە. ئەوانەی هیچ کارێك ناکەن بەزۆری ماندوون.

لە ژیاندا چەندانجار خەونەکانمان هەرەسیان هێناوە و ئارەزووەکانمان بە ناکامی دەبینین، بەڵام دەبێت درێژە بە خەونبینین بدەین، وەگەرنا ڕۆحمان دەمرێت و عەشق ناتوانێت بەفریادی بگات.





هەستی واقیعیبوون درووست لەو کاتەدا مرۆڤ لاوازدەکات کە لە هەر شتێك زیاتر پێویستی بە ئیمان و بە هێزی خۆیەتی.

---

لە دوژمنی خۆت خۆشبە، بەڵام بە دۆستی خۆتی مەزانە.

---

جەنگاوەری نوور قسەکانی حەریفەکەی دەبیستێت، تەنها ئەگەر پێویست بوو دەچێتە شەڕەوە.



عەشق هەمیشە لە ژیاندا تازەیە. گرنگ نییە جارێ، دوو جار، دە جار لە ژیاندا عاشق بیت. هەمیشە دەکەوینە دۆخێکەوە کە نایناسین.عەشق دەتوانێ ئێمە بۆ دۆزەخ یان بەهەشت بەرێت، بەڵام هەمیشە بۆ شوێنێکمان دەبات.

---

هەمیشە پێش هاتنەدیی خەونێك رۆحی جیهان بڕیاردەدات کە تەواوی ئەو شتەی بەدرێژاییی تەیکردنی رێ فێری بوویت، تاقیبکاتەوە.

---

دووهەمین نیشانەی مەرگی خەونەکانمان لە ئینکاریکردنەکانماندا شاردراونەتەوە. لەو روەوەی کە نامانەوێت ژیان بە پرۆسەیەکی گەورە ببینین، هێدیهێدی خۆمان لە کەمخواستنی ژیاندا بە دانا و بە ئینساف و راست دەزانین. لە دیوارەکانی بوونی رۆژانەمان دەڕوانین و دەنگی شکانی رمەکان دەبیستین، بۆنی تەپوتۆز و عەرەق دەکەین و شکستە گەورەکان و ئاگری ناخی جەنگاوەران دەبینین، بەڵام هەرگیز چێژی قووڵاییی ناخی شەڕکەران نابینین.





نیشانەی سێهەمی مەرگی خەونەکانمان ئارامگرتنە، ژیان بۆ ئاوابوونی یەکشەممە دەگۆڕدرێت و هیچ شتێکی گەورەمان ناوێت، ئیتر شتێکی زیاتر لەوەی کە ئامادەین ببەخشین، ناوێت.

😘 😘 😘
😘 😘 😘

کەسێك کە لە چاوەڕوانیی پاداشتێکدا عاشقە، کاتی خۆی بەفیڕۆدەدات.

😘 😘 😘
😘 😘 😘

شکست بوونی هەیە بەڵام ئازار بوونی نییە، جەنگاوەری راستەقینە دەزانێت بە شکست لە شەڕێکدا هونەری شمشێروەشێنیی خۆی بەهێز دەکات و بە توانایەکی زۆرترەوە لە شەڕی داهاتوودا بەشداری دەکات.

\

جەنگاوەر دەزانێت کە خۆڕاگری هیچ پەیوەندییەکی
بە کەللەڕەقییەوە نییە. هەندێجار شەڕ زیاد لە
پێویست درێژدەبێتەوە، هێزی جەنگاوەر بەفیڕۆدەدا و
شەیداییەکەی دەفەوتێنێت، لەبەرئەوە خۆی لە
مەیدانی شەڕ دەکشێنێتەوە و ئاگربڕ رادەگەیەنێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هیچ مرۆڤێك دوورگە نییە، بۆ ئەوەی شەڕی چاکە
ئەنجامبدەین پێویستمان بە یارمەتی هەیە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هیچ دەرفەتێك ئاوارتە نییە، خوداوەند لە ژیاندا
فرسەتگەلێکی زۆری بە مرۆڤان بەخشیوە.



یەکەمین رێگەی راستی بەرەو خودا نزا و پاڕانەوە و
دووەمین رێگە شادییە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

خودا قسەکانی لە دونیای دەوروبەرماندا نووسیوە، تەنها
ئەوەندە بەسە سەرنجبدەیتە رووداوەکانی ژیانت و
ببینیت کە خودا لە هەموو ساتەکانی شەو و رۆژدا
وشە و داخوازییەکانی لە کوێندەر دەنووسێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

حەقیقەت هەمیشە لەو شوێنەدایە کە ئیمانی لێیە:
بووداییەکان لەسەر هەقن، هندۆسەکان لەسەر هەقن،
مسوڵمانان لەسەر هەقن و جوەکان راستدەکەن. هەر کات
مرۆڤ راستگۆیانە رێگەی ئیمان بگرێتەبەر دەتوانێت
لەگەڵ خودادا یەکبگرێ و موعجیزە بخوڵقێنێت.





خودا لەو شوێنەیە کە مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی پێدەدەن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

شێوازگەلێکی زۆر بۆ خۆکووشتن هەیە. ئەو کەسانەی دەیانەوێ جەستەیان بکوژن، یاسای خودا ژێرپێدەنێن. ئەوانەش هەوڵدەدەن رۆحی خۆیان نابووتبکەن یاسای خودا ژێرپێدەنێن، هەرچەند گووناهەکەیان لە تێڕوانینی خەڵکییەوە کەمتر دیارە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەوڵ بەبێ ئیمان، شەڕێکی لەپێشدا براوە دەگۆڕێت بۆ دۆڕان.



جیهان لە دەستەکانی کەسێکدایە کە جوامێریی خەونبینین و ریسککردنی بۆ ژیانی خەونەکانی هەیە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

خەون بەهایەکی هەیە: خەونی گران و هەرزان هەن، بەڵام هەر خەونێك بەهایەکی هەیە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەستێرە سەوزەکان، ئەستێرە زەردەکان، ئەستێرە ئاویی و ئەستێرە سپییەکانمان هەیە، ئەستێرەی کلکدار و نەیزەکی درەوشاوە و نەیزەکی بەردمان هەیە، هەور و مەجەڕڕەمان هەیە. ئەوەی لەم خوارەوەوە بە فرەییەکی گەورە لە خاڵی هاوشێوە دەبینرێت لەڕاستیدا ملیۆنان شتی جیاوازن کە لە کەشێکی فراوانتر لە درکی مرۆڤەوە، بڵاوبوونەتەوە.





گرنگترین مەزنییەك كە مرۆڤ دەتوانێت ئەزموونی بكات، قبوولكردنی هێما و نهێنییە.

ئیمان بەر لە هەر زیانێك دەگرێت، ئیمان ژەهر دەگۆڕێت بۆ ئاوی رەوان.

مانای ژیانی ئێمە هەمان ئەو شتەیە كە دەمانەوێت وا بێت.



وەها دەزانین كە هەرچەند خەڵكی زیاتر لەگەڵمان هاوڕابن، ئەوا بیروباوەڕی ئێمە زیاتر بەدیدێت، بەڵام هەرگیز وا نییە.

بەڵێ ژیان لە شێتییەك زیاتر نییە، وەلێ دانایی جەنگاوەری نوور لە هەڵبژاردنی جۆری شێتییەكەیدایە.

ئەگەر هەر كەسێك تەنها ژیانی خۆی بژی و بهێڵێت خەڵكانی تریش بژین، خودا لە هەر چركەساتێكدا ئامادەیە و لە هەر دەنكێكی خەردەل لەو پارچە هەورانەی چركەساتێك هەن و چركەساتێكی تر دەڕۆن، خودا هەر لەوێیە و بەڵام خەڵكی باوەڕیان وایە دەبێت هەر وا بگەڕێن، چونكە قبوولكردنی ئەوەی كە ژیان تەنها ئیمانێكە زۆر سادە دێتە پێشچاو.

هەر جەنگاوەرێکی نوور بەر لەمە لە چوونە شەڕێکدا ترساوە، هەر جەنگاوەرێکی نوور بەر لەمە خیانەت و درۆی کردوە، هەر جەنگاوەرێکی نوور بەر لەمە گووتوویەتی ( بەڵێ ) لەکاتێکدا ویستوویەتی بڵێ ( نا ). هەر جەنگاوەرێکی نوور بەر لەمە خۆشەویستەکەی خۆی رەنجاندوە. هەر لەبەرئەمە جەنگاوەری نوورە، چونکە هەموو ئەمانەی تێپەڕاندوە، بەڵام ئومێدی خۆی بۆ باشتربوون لەدەستنەداوە.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

جەنگاوەر جنێوگەلێکی گەورە تەحەمول دەکات، هێزی مشت و لێوەشاوەییی لێدانەکانی خۆی دەناسێت. لە بەرامبەر حەریفی چاوەڕواننەکراودا لە قووڵاییی چاوانی رادەمێنێت و بێئەوەی پێویست بێت شەڕ بەسەر دونیای واقیعدا بسەپێنێت، سەردەکەوێت. جەنگاوەری نووریش هەر وەك شەڕکەرێك هێزی گەورەی خۆی دەناسێ و هەرگیز لەگەڵ کەسێکدا کە شایەنی شەڕی نەبێت، ناجەنگێت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧



جەنگاوەر شکست قبووڵدەکات و، بە بێباکییەوە بەرەو رووی نابێتەوە. هەروەها هەوڵنادات شکست بۆ سەرکەوتن بگۆڕێت. بۆ ئەو تامی شکست تاڵە، لە بێباکی ئازاردەچێژێت و لە تەنهاییی سەخت نائومێد دەبێت، بەڵام کاتێك هەموو ئەمانە تێپەڕین، زامەکانی دەلێسێتەوە و هەموو شتێك سەرلەنوێ دەستپێدەکاتەوە. جەنگاوەر دەزانێت کە جەنگ لە شەڕی زۆر پێکهاتوە، بەردەوام دەبێت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

بیر لەو شتەی تێتپەڕاندوە مەکەرەوە، هەموو شتێك لە رۆحی جیهاندا تۆمارکراوە و بۆ هەمیشە تێیدا دەمێنێتەوە.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

نووری عەشق تاریکیی گووناه دەڕەوێنێتەوە.

بێ ئارەزووی ژیاندنی ئەفسانەی خۆ، ناتوانرێت گەنجینەی ئەفسانەی کەسی بدۆزرێتەوە.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

هێرش و پاشەکشێ هەردووکیان بەشێکن لە شەڕی چاکە، ئەوەی لە شەڕدا جێگای نابێتەوە ئیفلیجبوونە لە ترسان.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

مرۆڤ تەنها بوونەوەری سرووشتە، کە لە مەرگی خۆی بەئاگایە. لەگەڵ ئەوەی دەزانین هەموو شتێك بە دوا مەنزڵ دەگات، کەچی ژیانی خۆمان دەگۆڕین بۆ شەڕێك کە شایەنی بوونەوەرێکە، ژیانی ئەبەدیی هەبێت.



مرۆڤەکان بەسەر چارەنووسی خۆیاندا زاڵن، هەمیشە دەتوانن هەمان ئەو هەڵانە بکەن، هەمیشە دەتوانن لە تەواوی ئەو شتانەی دەیانەوێت و ژیان سەخاوەتمەندانە دەیخاتە بەردەمیان، رابکەن.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

ئەرکەکانی رۆژانە هەرگیز لەسەر رێگەی رۆیشتنی مرۆڤ بەرەو خەونەکانی، نابنە رێگر.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

هیچ کەس ناتوانێت لە شکست رابکات، کەواتە باشتروایە مرۆڤ لە چەند شەڕێکدا بۆ خاتری خەونەکانی بدۆڕێت تا ئەوەی شکستبخوات بێئەوەی بزانێت بۆچی دەجەنگێت.





شەڕی چاکە شەڕێکە کە بە ناوی خەونەکانەوە ئەنجامدەدرێت. ئەو کاتەی لاوین بۆ یەکەمجار خەونەکانمان بە تەواوی هێزەوە لە ناخماندا دەتەقنەوە، زۆر دلێرین بەڵام هێشتا هونەری جەنگ فێر نەبووین. بە هەوڵی زۆر شێوازی شەڕکردن فێردەبین وەلێ لەو کاتەدا ئیدی جوامێریی چوونە ناو شەڕێکمان نییە، هەر بۆیەش لە دژی خۆمان رادەپەڕین و شەڕ لە دەروونی خۆماندا بەرپادەکەین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

کەسێك کە شادی دەناسێت، چیتر ناتوانێت بەبێ یاخیبوون خەم تەحەممولبکات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

جەنگاوەر بە رەوای نابینێت لە کاتی گەڕان بەدوای خواستەکانیدا ترس بەسەریدا زاڵ بێت، بەبێ عەشق ئەو هیچ نییە.



عەشق و بەنداو وەکیەکن، گەر بهێڵێت درزێکی بچووك دروست بێت ئەوا فیشقەکردنی تەنها دەزوولە ئاوێك لێوەی هێدیهێدی تەواوی دیوارەکە دادەڕمێنێت و ساتەوەختێك دەگات کە ئیتر هیچ کەس ناتوانێت بەر بە تەوژمی ئاو بگرێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بەهرە بۆ کەسێکە کە قبووڵی بکات، تەنها هێندە بەسە قبووڵی بکات و لە هەڵە نەترسێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەگەر بژیت خودا لەگەڵ تۆدا دەژی، ئەگەر ئامادە نەبیت مەترسییەکانی خوداوەند قبووڵبکەیت، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەهەشتە دوورەدەستە و بەتەواوەتی دەگۆڕێت بۆ بابەتی لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکان.





جەنگاوەری نوور دەزانێت کە دەرەنجام ئامراز ئاراستە
ناکات، چونکە دەرەنجامێك لە ئارادا نییە تەنها ئامراز
هەیە، ئەگەر تەنها بیر لە ئامانج بکاتەوە ناتوانێت
سەرنجبداتە نیشانەکانی رێ. ئەگەر خۆی تەنها بە یەك
پرسیارەوە ببەستێتەوە، وەڵامگەلێکی زۆر کە لە
کەناریدا هەن لەدەستدەدا و جەنگاوەر خۆی تەسلیمی
رێگە دەکات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

مرۆڤ هەرچەند لە خەونەکانی نزیکبێتەوە، ئەفسانەی
کەسی زیاتر دەگۆڕێت بۆ رێبەری راستەقینەی ژیانی.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

رێگەی مەعریفەت نەترسانە لە هەڵە.



دوو شت دەتوانێت رێگربێت لەبەردەم مرۆڤدا بۆ
دەستەبەربوونی خەونەکانی: ئەوەی کە پێی وا بێت
خەونەکان ناموومکینن، یان بە سووڕانەوەیەکی کتوپڕی
چەرخی فەلەك درووست لەو کاتەی هیچ چاوەڕێی
ناکات، ببینێت وەدیهاتنیان موومکین بوە. لەم ساتەدا
لەپڕێکدا ترسێك سەرهەڵدەدات، ترس لە رێیەك کە
مرۆڤ نازانێت بە کوێ کۆتاییدێت، لە ژیانێکی پڕ لە
کێشمەکێشمە نەناسراوەکان، لە ئەگەری ونبوونی لەناکاوی
هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ عادەتی پێوە گرتوون.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

تەنها شتێك کە دەتوانێت دەستەبەربوونی خەونێك
ناموومکین بکات: ترس لە شکستە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەمیشە بڕوام وەها بوە چ لە هەر مرۆڤێکدا و چ لە سەرانسەری کۆمەڵگادا، ئاڵوگۆڕی قووڵ لە سەردەمە کاتییە زۆر کورتەکاندا روودەدەن، رێك ئەو کاتەی هیچ چاوەڕێی نین. ژیان ململانێ دەخاتە بەردەممان، تا شەهامەت و ئیرادەمان بۆ گۆڕانکاری تاقیبکاتەوە. لەو ساتە بەدواوە هیچ دەرەنجامێکی نییە کە وەهای دەربخەین شتێك رووی نەداوە یان بیانووبهێنینەوە کە هێشتا ئامادەنین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

لە ژیاندا هەندێ ساتەوەخت هەن، تەنها رێگە لەدەستدانی هەڵبژاردنە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەندێجار رووداوێکی ناگرنگ دەتوانێت جوانی بگۆڕێت بۆ چرکەساتێکی پڕ دەردەسەری. بۆچی کا لە چاوانی خۆماندا دەبینین و کێوەکان، دەشتەکان و درەختە زەیتوونەکان نابینین.



ئەوانەی خۆیان بە دانا دەزانن، لە ساتەوەختی پێویستبوونی گۆڕاندا بەگوومان دەبن و لە ساتەوەختی گوێڕایەڵیشدا لاسار دەبن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

لە ژیاندا هەندێ چرکەسات هەن جگە لە خەم و ئازار هیچ شتێکی تر روونادات و ناتوانین خۆمانیان لێ بەدوور بگرین، بەڵام ئەم رووداوانە هۆکارێکیان هەیە کە ناتوانین بەر لە ئەزموون یان تەنانەت لە ساتەوەختی ئەزموونندا وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، تەنها کاتی سەرکەوتن بەسەریاندا هۆکاری بوونیان تێدەگەین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئێمە هەموومان لە دونیای تایبەتیی خۆماندا دەژین، وەلێ ئەگەر سەیری سەرەوە، سەیری ئاسمانی پڕ ئەستێرە بکەیت، دەبینیت کە تەواوی دونیا جیاوازەکان لەوێندەر ئاوێزانی یەکدی دەبن و شێوە فەلەکییەکان، کۆمەڵەی خۆر و کاکێشانەکان دروستدەکەن.





هەستەکان بەشێکن لەو دونیایەی هیچ زەمان و شوێن و سنوورێکی نییە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

واتای شەیدایی ئەمەیە: دروستکردنی وێنەیەك بۆ کەسێکی تر بێئەوەی بەو کەسە بڵێیت کە ئەم وێنەیە چییە. وەختێ هاودڵی و لەیەکنزیکبوونەوە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی کەسێتییە راستەقینەکەی بەرامبەر، ئەوان حاڵیدەبن، کە لەودیو ئەم وێنەیەوە ژن و پیاوێکی ئاسایی هەیە و ناتوانن ئەم راستییە لەبەرچاو نەگرن. بە دامرکاندنەوەی سەرنجڕاکێشانەکە، بەهێزی و لاوازییە مرۆییە هاوبەشەکان دەردەکەون. کاتێك یەکێك لەوان نیشانی دەدات کە راستییەکەی چۆن بوە، ئەوی تر دەیەوێت هەڵبێت، چونکە ئەمە بە مانای رماندنی ئەو جیهانە دێت کە ئەوان دروستیان کردبوو.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙



زەوی بە بڕی دابینکردنی پێویستییەکان بەرهەمدەهێنێت، نەك بە بڕی تێرکردنی تەماع.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

مرۆڤ کاتێك پیر دەبێ و لە مەرگ نزیکدەبێتەوە، بڕوا بە زۆر شت دەهێنێت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

مرۆڤە بەتەمەنەکان کاتیان تەنها لە روانینە ئاراستەیەکدا سەرفدەکەن کە بریتییە لە رابردوو، دەزانن بەم جۆرە رووبەڕووی هیچ مەترسییەك نابنەوە، بەڵام ئەگەر سەیری داهاتوو بکەن یەکسەر مەرگ دێتە بەر دیدەیان.

ئەگەر تۆ بە گفتدان بەوەی کە هێشتا نیتە بە دوای شتێکدا بگەڕێیت، حەزی گەیشتن بەو شتە لەدەستدەدەیت.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

قسەکردن و سەلماندن و قەناعەتپێکردنی کەسێك بۆ ئەوەی بزانێت خۆشماندەوێت، پێویست نییە. مرۆڤ کەسێکی خۆشدەوێت تەنها لەبەرئەوەی خۆشیدەوێت، ئەوەندە و ئیدی هیچ بەڵگەیەك بۆ خۆشەویستی نییە.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

هەرگیز ناتوانیت ئەو شتەی کە هی خۆت نییە پێشکەشی یەکێکی تری بکەیت.



وەختێ ئێمە بەردەوام لە چواردەوری خۆماندا کەسانێکی دیاریکراو دەبینین، هەستدەکەین ئەوان بەشێکن لە ژیانی ئێمە. جا کە دەبنە بەشێك لە ژیانی ئێمە، سەرەنجام بڕیاردەدەن ژیانمان بگۆڕن و، ئەگەر وەك ئەوەی ئەوان پێیان خۆشە نەبین، ئەوا لێمان قبووڵناکەن. هەموویان وەها دەزانن کە زۆر باش دەزانن، ئێمە دەبێت چۆن بژین.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

مرۆڤ بۆ چاکەکردن یان بۆ یارمەتیدان یان بۆ پاراستنی کەسێك خۆشەویستی ناکات. ئەگەر وەها بێت ئەوەی خۆشمان دەوێت وەك شتێك وەردەگرین و خۆشمان بە کەسێکی عاقڵ و سەخاوەتمەند دەزانین، ئەمەش هیچ پەیوەندییەکی بە عەشقەوە نییە. عەشق واتە ئاوێتەبوون، پەیوەستبوون، یەکدی لەئامێزگرتن و بەدەستهێنانی نووری ئیلاهی لە مەعشووقدا.

❧ ❧ ❧
❧ ❧ ❧

عەشق پڕە لە داو، خۆشەویستی بە واتای لەدەستدانی کۆنترۆڵ.

خەڵكانێك هەن وەختێ دڵیان لە كەسێك دەڕەنجێت، ئیدی لەگەڵ خۆشیان و ژیانی خۆشیاندا زویر و دڵگیر دەبن، ئینجا هەر لەسەر بنەمای ئەم عاجزی و نارەحەتییانەی خۆیاندا سیناریۆیەك ڕێكدەخەن و هەر خۆشیان ڕۆڵی تێدا دەگێڕن.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

عەشق وەك مادەیەكی سڕكەر دەمێنێتەوە. یەكەمجار هەستێكی خۆش دروستدەكات: هەستی تەسلیمبوونی تەواو، ڕۆژی دواتر هەر هەمان هەست و بگرە زیاتریشت دەوێت. هێشتا هۆگری نەبوویت وەلێ چێژ لەم هەستە وەردەگریت و واش دەزانیت كە دەتوانیت كۆنترۆڵی بكەیت. ئەگەربێتو چەند خوولەكێك بیر لە مەعشووقەكەت بكەیتەوە، ئەوا چەند سەعاتێك دوای ئەو بیری لێ ناكەیتەوە، بەڵام هێدیهێدی خووی پێوەدەگریت و پێوەی وابەستە دەبیت. ئەو كات بە پێچەوانەوە چەندان سەعات بیری لێ دەكەیتەوە و تەنها چەند خوولەكێك لە بیرت نابێت. ئەگەر لەلات نەبێت هەمان هەستی مووەدمینێكی تلیاك لێبڕاو دادەگرێت. بە هەمان شێوەی مووەدمینێك كە دزیدەكات و خۆی سووكدەكات تا ئەوەی دەیەوێت بەدەستی بهێنێت، تۆش ئامادەیت لە پێناوی عەشقدا هەموو شتێك بكەیت.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙



ئێمە ئەوەندە خێرا بە ڕێدا هاتووین كە ئیدی نازانین چی دەكەین. ئەمێستا دەبێت قەیرێك ڕاوەستین تا ڕۆحمان پێمان دەگاتەوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ڕێك لەو كاتەی كە توانیم هەموو وەڵامەكان بدۆزمەوە، هەموو پرسیارەكان گۆڕان. ئێمە بەردەوام لە دۆزینەوەی وەڵامداین، هەستدەكەین وەچنگهێنانی وەڵامەكان بۆ پەیبردن بە مانای ژیان زۆر پێویستن، وەلێ لەوە گرنگتر ئەمەیە كە بەتەواوی دڵبدەینە ژیان و ڕێگەبدەین هێواش هێواش ڕازەكانی بوون خۆیمان بۆ ئاشكرابكات. ئەگەر زۆر بەدوای دۆزینەوەی ماناوە بین بۆ بوون، دەبینە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی كە سرووشت ڕۆڵی خۆی بگێڕێت و ناتوانین پەی بە نیشانەكانی خودا بەرین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

پەند تیۆرەیەكە لەمەڕ ژیانەوە، وەلێ ڕاستیی ژیان زۆر جیاوازە.

هیچ شتێك لەوە باشتر نییە كە بە نێو دەروونی خۆماندا رۆبچین. لەوێ منداڵێكی ترساو هەیە بە باشی نازانێت چی دەكات، چونكە نە دەنگی دەبیسترێت و نە راوێژی پێ دەكرێت. دەبێت لە پەیوەند بەم منداڵەوە لەسەرخۆ بین. دەبێت تا ئەو كاتەی پێویست دەكات، رێگەبدەین جڵەوبگرێتەدەست، تا دووبارە هەستبكاتەوە كە میهرەبانیی لەگەڵدا نوێنراوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەندێجار لە پەیوەند بە مەسەلەگەلێكی تایبەتەوە دەمارگیری نیشاندەدەین و، تەنها ئەو كاتە لە هەڵەكەی خۆمان تێدەگەین كە زۆر درەنگە. هەر لەبەرئەوە چاك وایە هەمیشە ئەو رستەیەی گۆتەمان لە بیر بێت: ﴿هیچ كەس ناتوانێت لە خۆمان باشتر فریومان بدات.﴾

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

هەرگیز نابێت لەوی دی بپرسین: ﴿لە ژیاندا چی دەكەیت؟﴾ پرسیاری مرۆڤی هۆشمەند ئەوە دەبێت: ﴿ئایا وەفاداری بۆ خەونەكانت؟﴾



لە زۆر بواردا – هەر بەو جۆرەی كە لە نیشانەكانی رێنمایی هاتوچۆدا روودەدات – گووماندەكەین كە فلاّنە نیشانەی رێنمایی هیچ سوودێكی نییە و، پەیڕەویی لێ ناكەین. جارێك، دووجار، لە چرای سوور دەپەڕینەوە و هیچ شتێك روونادات. لەسەر ئەم رەفتارە رادێین، هەتاكو رۆژێك ...
بۆیە وریا بن، لە پەیوەند بە ئارەزووەكانتانەوە بێپەروا مەبن: بەختی خۆتان بە شتە بێكەڵكەكان تاقیمەكەنەوە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەوە كات نییە كە مێشكی مرۆڤ دەگۆڕێت، زانیاریش نییە بەڵكو ئەوەی مێشكی مرۆڤ دەگۆڕێت خۆشەویستی و نائومێدییە. لەوانەیە خۆشەویستی بتوانێت كەسێك بگۆڕێت، بەلاّم نائومێدی خێراتر ئەو كارە دەكات.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

جیهان هەر وەها بوە: خەڵكان بە شێوەیەك لە شتەكان دەدوێن وەك بڵێی هەموو شتێك دەزانن، بەلاّم ئەگەر بوێریت پرسیاریان لێ بكەیت، هیچ نازانن.

له خۆشەویستیدا کەس ناتوانێت ئازاری کەسی تر بدات. ئێمە خۆمان بەرپرسی هەستەکانی خۆمانین و ناکرێت سەرزەنشتی کەسانی تر بکەین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

بۆ ئەو خۆشەویستانەی پێیان ناگەیت، ئازارمەچێژە. کەس کەسی لەدەستناچێت چونکە کەس خاوەنی کەس نییە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

مانای راستەقینەی ئازادی ئەوەیە: گرنگترین شتی ئەم جیهانەت هەبێت بەبێ ئەوەی خاوەنی بیت.



خۆشەویستی لە کەسانی دیکەدا نادۆزرێتەوە، بەڵکو لە خۆماندایە و هەر خۆمان خەبەری دەکەینەوە. بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەش پێویستمان بە کەسی دوەم هەیە. جیهان تەنها کاتێك مانای هەیە کە کەسێك دەدۆزینەوە و هەستەکانمانی لەگەڵدا بەشدەکەین.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

گەورەترین چێژ لە سێکسدا نییە، بەڵکو ئەو سۆزەیە کە پێی ئەنجامدەدەیت. کاتێك سۆز چڕدەبێتەوە بۆ تەواوکردنی سەماکە، سێکسیش دێتەناوەوە، بەڵام ئەوەش هەمیشە ئامانجی سەرەکی نییە.

☙ ☙ ☙
☙ ☙ ☙

ئەوان لەسەر جادەکە کەوتنە ماچکردنی یەکتر، هەندێ لە خەڵکی سەیرێکی نابەجێیان دەکردن. ئەوەی ئەوان دەیانکرد عەیب نەبوو، بەڵکو ئەوە عەیب بوو کە خەڵکەکە خۆشیان حەزیان دەکرد هەمان شت بکەن و حەسوودیان بەمان دەبرد.





**سەرچاوەکان**

١- کێوی پێنجەم
٢- یادەوەرییەکانی پیرێك
٣- شەیتان و خانم پریم
٤- کتێبی رێبەری جەنگاوەری نوور
٥- ڤاڵکیرییەکان
٦- بریدا
٧- کیمیاگەر
٨- لە کەنار رووباری پیدرادا دانیشتم و گریام.
٩- ڤێرۆنیکا بڕیاردەدات بمرێت.
١٠- مەکتووب
١١- هەندێ وتەی بڵاونەکراوە
١٢- دووهەمین مەکتووب
١٣- یانزە خوولەك

**روونکردنەوە**

١- چواردە وتەی لە کۆتایی وتەکانەوە، لە وەرگێڕانە فارسییەکەدا نەبوون، شەشیان لە کتێبی ﴿ دووهەمین مەکتووب﴾ەوە دەرهاتوون کە برای وەرگێڕ، کاك ﴿یاسین عومەر﴾ کردوێتی بە کوردی. هەروەها هەشتیشیان لە کتێبی ﴿یانزە خوولەك﴾ ەوە وەرگێڕدراون، کە لەلایەن برای وەرگێڕ، کاك ﴿ئەیوب نووری﴾ یەوە کراوەتە کوردی. لەگەڵ سووپاسماندا بۆ ئەم دوو وەرگێڕە بەڕێزە.
٢- هەروەها چەند وتەیەکیش لە رۆمانی ﴿ ڤاڵکیرییەکان ﴾ وەرگێڕدراوە، کە خۆمان وەرمانگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
٣- چەند وتەیەك لە وەرگێڕانە فارسییەکەدا دووبارەکراونەتەوە، ئێمە لێرەدا دووبارەکردنەوەیانمان بەپێویست نەزانی و لامان بردن.